یەکەمین ماڵپەڕی کوردی تایبەت بە پرسیار و وەڵامی شەرعی



# چۆن یارمەتی منداڵەکانم بدەم

## بۆ لەبەرکردنی قورئان ؟

وەرگێڕانی
ستافی ماڵپەڕی بەهەشت و وەڵامەکان

ba8.org - walamakan.com

**بسم الله، والحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن اهتدى بهداه ،**

**أما بعد:**

بێگومان کۆمەڵێک ڕێگەی هەمەجۆر هەیە بۆ ئەوەی منداڵ ڕازی بکرێت بۆ لەبەر کردنی قورئان، بەڵام ڕێگەی خۆشەویستی و خۆشەویست کردن و حەز و خواستن هەر بە ڕێگەی یەکەم و بنچینەیی ئەمێنێتەوە کە ئەکرێ پشتی پێ ببەسترێ لەم بابەتەدا ، لە پاش دوعاکردن و پشت بەستن بە خوای گەورە و پێویستی پێ بوونی ، وێڕای ئەوەی کە دایک و باوک سەرمەشقی یەکەمن بۆ ئەوەی



بگەن بەو ئامانجەی منداڵەکانیان قورئان لەبەر بکەن ، لەگەڵ خۆڕاگری و ئارامگرتن ، وە دووبارە کردنەوەی هاندان و ئامۆژگاریێکان و نەرم و نیان بوون لەگەڵیان ، وە چاودێریەکی چڕوپڕ لەلایەن دایک و باوکەوە لەم کارەدا ، بەتاییەت دایک کە بناغەی یەکەمە لەم کارە مەزنەی لای خوای گەورە .

* * * * * * *

**ئەمەش هەندێک ڕێپیشاندان بۆ هاوکاری کردنتان**

**١- بەرەکەتی گوێ گرتن لە قورئان لەلایەن ئافرەتی دووگیانەوە :**

کۆمەڵێک لە زانایانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەڵێن کۆرپەلە کاریگەر دەبێت بە گشت بارودۆخەکانی دایکییەوە لە کاتی دڵخۆش بوون و تووڕەبوونی ، وە لە کاتی بەختەوەری و دڵتەنگیدا ، بۆیە ئەگەر بە دەنگی بەرز شتێک بخوێنێتەوە ئەوا کۆرپەلەکەی بەو خوێندنەوەیە کاریگەر دەبێت ، دەی ئەگەر ئەو خوێندنەوەیەی قورئانی پیرۆز بێت چی ؟! ، یان ئەگەر دایکە دووگیانەکە زۆر گوێ لە قورئان

بگرێت ، ئەو ئارامییەی کە هەستی پێ دەکات بۆ کۆرپەلەکەشی دەگەڕێتەوە و دەبێتە خێرێکی گەورە بۆی ، وە ئەوەشی خوای گەورە لە پەنهانییەکاندا دروستی دەکات ئەوە گەورەتریشە .

* * * * * * *



## ٢- گوێگرتن لە قورئان و خوێندنەوەی لە ماوەی شیردان بە کۆرپەلە .

کۆمەڵێک لە زانایان ئەڵێن کۆرپەی شیرخۆر بە شتەکانی چواردەوری زۆر کاریگەر دەبێت ، بەجۆرێک هەستی بیستن ئامادە ئەبێت بۆ وەرگرتنی ئەو دەنگانەی چواردەوری ، بۆیە کۆرپەلەکە ئەو وشە و دەستەواژانەی کە دەیبیستێت خەزنی دەکات هەرچەندە نەشتوانێ ئەو وشانە بەکار بێنێت و قسەی پێ بکات لە ماوەی شیرپێدانی دا ، بەڵام دواتر قسەی پێ دەکات ، بۆیە ئەگەر لەو ماوەیەدا کە کۆرپەلەکەت گوێ لە قورئان بگرێت یان قورئان بە

دەنگێکی بەرز بخوێننەوە ئەوا بێگومان زۆر کاریگەری دەبێت لەسەر کۆرپەلەکە ، وە دواتریش بە ئاسانی قورئان لەبەر ئەکات بە ویستی خوا ، هەر بۆیە دەبینین خوای گەورە ئامۆژگاری دایک دەکات کە ماوەی دوو ساڵ شیر بە کۆرپەکەی بدات ، وە ئەوەشی کردۆتە مافێک لە مافەکانی منداڵ بەسەر دایکییەوە ، وەک دەبینین خوای گەورە لەو ماوەیەدا کەفالەتی دایک دەکات بەوەی لە ڕێگەی ڕۆزی دانی باوکی منالەکەوە پۆشاک و خۆراک بۆ خۆی و کۆرپەکەشی دابین بکات ، وەکو فەرمایشتی :

﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ



أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ . [سورة البقرة:٢٣٣]

واتە : دایکان تادوو ساڵی تەواو دەتوانن شیر بەمناڵەکانیان بدەن، ئەو دووساڵەیش بۆ کەسێکە کە بیەوێ دەورانی شیرپێدان تەواو بکات؛ لەوماوەدا ئازووقەو جلك و پۆشاکی ئەودایکە شیردەرەیە لەسەر باوکی منداڵەکەیە، دەبێ بەشێوەیەکی جوان و بەپێی باوی موسڵمانانی ئەوشوێنە ئەنجام بدرێت.

* * * * * * *

## ٣- خوێندنەوەی قورئان لەپێش منداڵەکان :

چەندان منداڵی بچوکمان بینیوە لاسایی باوکی دەکاتەوە لە دانیشتن و جوڵەکانی چوونە ڕکوع و سجودەوە ، بۆیە بەزۆر خوێندنەوەی قورئان لە پێش چاویان خۆشەویستی قورئان ئەچێتە دڵیانەوە ، بۆیە دواتریش ئەتوانیؒ هانیان بدات بۆ لەبەر کردنی ، وێڕای ئەوەی خوای گەورە بەرەکەتێکی زۆر دادەڕژێنێتەوە سەریان بەهۆی خوێندنەوەی قورئانەوە ، وە گشت خانەوادەکەی ئەو خێرەیان بەر ئەکەویؒ ، وە کۆبوونەوەی خێزان بۆ خوێندنەوەی قورئان کارێکی خوازراو و زۆر خۆشەویستە ، وە فەزڵەکەشی لە ئەژمار نایەت .

## ٤- جوانترین دیارییەک کە بدرێتە منداڵان بریتیە لە قورئان :

سروشتی ئینسان وایە حەزی لە خاوەنداریێتییە ، وە لەبەر ئەوەش منداڵان زۆر پەیوەستن بە یارییەکانیانەوە وە لە شوێنێکی دیاریکراو یارییەکانیان ئەشارنەوە ، وە گشت جارێکیش دەیژمێرن ، بۆیە ئەم پاڵنەرە سروشتییە دەبێ بە شێوازێکی ئەرێنی بەکاری بێنین ، پاشان بەخشینی قورئان بە منالەکان لە بۆنە و یادە جیاوازەکان وایان لێ دەکات زیاتر پەیوەستی قورئان بن ، ئەمەش وایان لێ دەکات ڕوو بکەن لە لەبەرکردنی قورئان بەبێ دوودڵی .

## ٥- ئاهەنگ گێڕان لە پاش ئەوەی منداڵەکانمان خەتمی قورئان ئەکەن :

هاندان و خواستن لە ناخدا شرینن ، وە لە ناخی منداڵاندا زیاتر ، بۆیە هەر جارێک خوای گەورە تەوفیقی منداڵەکانمانی دا بە خەتم کردنی جوزئێک لە قورئان ئەوا با دیارییەکیان پێشکەش بکەین لە ئاهەنگێکی بچوکدا ، ئەمەش دەبێتە ڕووداوێکی لەیاد نەکراو لە ژیانی منالەکەدا ، وە دەبێتە هەلێک و ئاوات دەخوازێت دووبارە بێتەوە ، وە پەیوەست بوونیشی بە قورئان زیاتر ئەکات ، تاکو دەگات بە قۆناغی خۆشەویستی گەورە ، هەربۆیە

ڕووکردنە لەبەرکردنی قورئان بە خۆشویستییەکی زۆرەوە دەبێت بۆ قورئان بەبێ فەرمان کردن و توندی و زبری .

* * * * * * *

## ٦- گێڕانەوەی ئەو چیرۆکانەی کە لە قورئاندا هاتووە بۆ منداڵان :

منداڵ حەزی لە چیرۆکە ، بۆیە ئەگەر دایک و باوک بە شێوازێکی ئاسان و تامەزرۆییەوە چیرۆکەکانی نێو قورئان بۆ منداڵەکانیان بگێڕنەوە و پەند و ئامۆژگارییەکانی ناو چیرۆکەکەیان بۆ باس بکەن بە شێوازێک منداڵەکە بە ئاسانی لێی تێ بگات هەرکات گوێی لێ گرت ، ئەنجا کۆتایی چیرۆکەکەش بە ئایەتێکی قورئان بێت کە پەیوەندی هەبێت بەو چیرۆکەی گێڕاویەتییەوە ، ئەمەش هۆکارە بۆ پەیوەست بوونی منداڵ بە قورئانەوە ، وە

هاندانیشە بۆ زیاتر گوێ گرتن لە قورئانی پیرۆز ، بەڵکو بۆ لەبەر کردنی بە ئاسانی ، هەموو ئەمانەش ئەبنە هۆکاری گەشەکردنی باڵانسی زمانەوانی قورئان لەلای منداڵەکە .

* * * * * * *

## ٧- پێشبڕكێی لەبەر كردنی قورئانی پیرۆز ، بەتایبەت سورەتە كورتەكان :

پێشبڕكێ بكرێت لەناوماڵدا لە نێوان منداڵەكاندا ، یان بانگی هاوڕێكانیشی بكرێت بۆ هاندانی ئەوانیش بۆ لەبەر كردنی قورئان ، یان بانگی منداڵی دراوسێكانیش بكرێ ، وە دەبێت تەمەنی منداڵەكان لەبەرچاو بگیرێت بۆ پرسیار كردن لێیان ، وە ئەوەی پرسیاریان لێ بكرێ سەبارەت بەو ئاژەڵەی كە ئەبرەهەی حەبەشی بەكاری هێنا لە جەنگەكەی لە دژی قوڕەیش ـ كە فیل بوو ـ ، یان پرسیار بكرێ سەبارەت بە وشەیەك لەسەر گەشت و سەفەر لە

سوورەتی قورەیش کە (رحلة)ـیە ، هەروەها پرسیار لەسەر دوو وەرز لە وەرزەکانی ساڵ لە سوورەتی (قریش) کە زستان و هاوینن (الشتاء والصیف) ، یان بڵێی وشەیەکم بۆ بێنەوە لەسەر برسێتی کە وشەی (الجوع) ، هەروەها هەر پرسیارێکی دیکە کە بۆ منداڵ گونجاو بێت و هانیان بدات بۆ لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز .

* * * * * * *

## ٨- دەبێت منداڵان لە سەرەتای تەمەنیان فێری زانستیان بکەین لە ڕێگەی قورئانی پیرۆزەوە .

منداڵەکان فێری خوێندەواری و نوسین ئەکەین لە ڕێگەی ئایەتەکانی قورئانەوە ، فێری ژمارەکانیان ئەکەین لە ڕێگەی ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژەوە ، فێری زانستی زیندەیان ئەکەین بە باسکردنی ئەو ئاژەڵانەی کە لە قورئاندا باسکراوە ، فێری مێژوویان ئەکەین لە گێڕانەوەی چیرۆکی نەتەوەکانی پێشوو ، فێری زانستی گەردووناسییان ئەکەین بە باسکردنی ئەو ئایەتانەی کە سەبارەت بە ئاسمانەکان و زەوی و ڕووبار و دەریاکانن ، وە زۆر شتی تریش ، گشت ئەمانەش دەبنە هۆی زیاتر پەیوەست بوونی منداڵ بە قورئانەوە.

## ٩- گەڕان بەدوای ئەو وشانەی قورئان کە گونجاون بۆ تەمەنی منداڵ بۆ فێرکردنی :

منداڵ لە سەرەتای تەمەنیدا هەڵپەی هەیە بۆ گەشەکردنی باڵانسی زمانەوانییەکەی ، وە هەوڵ ئەدات چەندەی پێ ئەکرێ فێری وشە و دەستەواژەکان ببێ ، وە هەوڵێ لکاندنیان ئەدات بۆ دروستکردنی ڕستە ، بۆیە دەبێ ئەو هەلە بقۆزینەوە بە یارمەتی دانیان لەسەر گەشەکردنی باڵانسی زمانەوانییەکانیان لە قورئانی پیرۆزدا ، بەتایبەت لە کورتە سوڕەتەکان ، بۆنمونە لێیان بپرسین وشەی (قریش) لە چی سورەتێکە ؟ ، وە وشەی (التین

والزَّيتون) يان جگە لەوانەش لە چی سورەتێکە ؟ ،
ئەمەش وا لە منداڵ دەکات ئەو سورەتە لەبەر بکات ،
وە حەز بە ناسینی ئەو وشە و دەستەواژانەش ئەکات
کە لەناو سورەتەکەن .

* * * * * * *

## ١٠- دەبێ کارێک بکەین قورئان ببێتە هاوڕێی منالّەکانمان لە بەیانیان و ئێوارانداا :

بۆ نمونە قورئانێکی قەبارە بچوکیان بە دیاری پێ ببەخشین ، وە هانیان بدەین کە هەمیشە پێیان بێت بەو پێیەی کە سەرچاوەی ئارامی و دڵنەواییە بۆیان ، وە بەرەکەتێکە بۆیان کە هەمیشە لەگەڵیانە لە بەیانیان و ئێوارانداا ، وە دەیانپارێزێت لە خراپەکان بە ویستی خوای گەورە ، بەوەش زیاتر پەیوەستی قورئان دەبن ، وە ویستی لەبەر کردن و هەڵگرتنی لە سینگیان زیاتر دەبێت ، ئەمەش لەگەڵ فێرکردنی چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ قورئانی پیرۆز .

**١١- هاندانی مناڵەکان بۆ سەیرکردنی ئەو کەناڵانەی کە تایبەتن بە قورئانەوە ، بەتایبەت ئەو کەناڵانەی کە پەخشی پێشبڕکێیەکانی لەبەرکردنی قورئان ئەکەن :**

سەیرکردنی ئەو دیمەنانە هانیان ئەدات بۆ کێبڕکێ کردن بۆ لەبەر کردنی قورئان ، چونکە کاتێک ئەو منداڵانەی هاوتەمەنی خۆی ئەبینێت کە کێبڕکێی لەبەر کردنی قورئان ئەکەن ، وە زۆر ڕێزی لێ ئەگرن و شکۆمەندی ئەکەن بەهۆی ئەوەی قورئانیان لەبەرە ، وە دایک و باوکانیش هانی مناڵەکانیان ئەدەن بۆ لەبەرکردنی قورئان و بەشداری کردن لەو جۆرە

پێشبڕکێ خواپەرستییە ، وە با لە گوێیەکانیان ئەوەش دابکوتین کە ئێوەش ئەتوانن وەکو ئەو منداڵانە بن کە لە تەلەفزیۆن ئەیانبینین بەڵکو لەوانەیە لەوانیش باشتر بن .

* * * * * * *

## ١٢- بەکارهێنانی کەرەستە و ئامێرەکانی سەردەم کە ئاسانکارە بۆ لەبەر کردنی قورئان :

بەهۆی ئەوەی زۆرێک لە منداڵان حەز و خولیایان هەیە بۆ ئامێر و کەرەستەکانی سەردەم ، جا گەر لەم لایەنەوە دەستباری منداڵەکانت بیت ئەوا ئاسانکاریت کردووە بۆیان بۆ لەبەرکردنی قورئان ، هەروەها لە ڕێگەی ئەو ئامێرانەوە ئەتوانن دەنگی خۆیان تۆمار بکەن کاتێک قورئان ئەخوێنن و دواتر گوێی لێ بگرنەوە ، بەوەش ئەتوانن هەڵەکانی خۆیان بزانن .

**١٣- با هانی منداڵەکانمان بدەین بۆ بەشداریکردن لە گشت ئەو پێشبڕکێیانەی کە ساز ئەکرێت بۆ لەبەر کردنی قورئان ، چ لەناو مزگەوت بێت یان قوتابخانەکان یان ڕێکخراوەکان :**

زۆرجار منداڵ بەتەنیا ناتوانێت قورئان لەبەر بکات ، بەڵام ئەگەر کارەکە بە کۆمەڵ و گرۆ بێت ئەوا دەبنە کێبڕکێ کاری یەکتر ، بەتایبەت ئەگەر خەڵات بدرێت بە زیرەک و سەرکەوتووەکان ، جا منداڵیش هەمیشە هەوڵی سەرکەوتن ئەدات ئەگەر چی شانسیشی نەبێت ، جا منداڵ لەو کێبڕکێیەی لەبەر کردنی قورئان بەردەوام ئەبێت تاکو ویستێکی

فیترِی لا دروست ئەبێت بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز ، هەروەها دەستخۆشی و ستایش بکرێت بەهۆی ئەو هەوڵ و ویستە بەردەوامەی کە هەیەتی بۆ لەبەر کردنی قورئان .

* * * * * * *

## ١٤- هاندانی منداڵان بۆ تۆمارکردنی دەنگیان لەکاتی قورئان خوێندندا :

ئەم کارە متمانە بەخۆبوون پەیدا ئەکات لای منداڵان ، وە هەستی توانین لایان دروست ئەبێت بۆ لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز بە ویستی خوا ، وە لەوانەیە خوای گەورە تەوفیقیان بدات ببن بە قورئانخوێن ، بەڵکو ببن بە یەکێک لە قورئانخوێنە ناسراوەکانیش ، هەروەها بەردەوام تۆمارکردنی دەنگیان وا ئەکات لە منداڵەکە بزانێت چەندە چۆتە پێشەوە و خوێندنەوەی باشتر بووە ، وە لە قۆناغێکەوە دەچێت بۆ قۆناغێکی تر .

## ١٥- هاندانی منداڵان بۆ بەشداری کردن لە گشت چالاکییە ئاینییەکان لە قوتابخانەکاندا بە خوێندنەوەی قورئان :

بێگومان زۆرێک لە کاروچالاکییەکان هۆکاری دەرکەوتنی کۆمەڵێک لە خاوەن بەهرەکان بووە کە دواتر درەوشاونەتەوە ، بۆیە بوونەتە کەسایەتییە تایبەتەکانی نێو کۆمەڵگە ، جا بەڕاستی بەشداری کردنی منداڵان لە ڕادیۆکان بە خوێندنەوەی قورئان ، وە ستایش کردنی لەلایەن مامۆستاکانی و بەرپرسانیش دەبێتە هاندانی بۆ زیاتر پەیوەست بوونی بۆ لەبەر کردنی قورئان ، وە هەر لەم

سۆنگەیەشەوە بە مامۆستا و بەڕێوەبەران ئەڵێین پێویستە لەسەریان هانی منداڵان بدەن بۆ لەبەر کردنی قورئان ، وە گشت جارێک دەستخۆشیان لێ بکەن بۆ ئەو کارەیان ، وە لە پۆلەکاندا باسیان بکەن و ستایشیان بکەن ، تاکو خۆشەویستیان بۆ قورئان زیاتر بێت ، وە زیاتر پەیوەستی لەبەر کردنی قورئان بن و جوانتر بیخوێننەوە ، هەروەها پێویستە لەسەر دایک و باوکیش بەردەوام لە پەیوەندیدا بن لەگەڵ مامۆستاکان تاکو ئەو پەیوەستیەی منداڵەکانیان بە لەبەر کردنی قورئان گەشە پێ بدەن لە ناخیاندا .

### ١٦- گوێگرتن لە منداڵ کاتێک کە قورئان ئەخوێنێت یان کاتێک کە چیرۆکەکانی قورئانمان بۆ دەگێڕنەوە :

زۆرجار دەبینین هەندێک لە مامۆستایان یان هەندێک لە باوکان گرنگی نادەن بە خوێندنەوەی منداڵەکانیان یان کاتێک چیرۆکی قورئانیان بۆ دەگێڕنەوە ، ئەمەش وا دەکات لە منداڵ دوور بکەوێتەوە لە خوێندنەوەی قورئان و گێڕانەوەی چیرۆکەکانیشی پشتگوێ بخات ، بەڵکو ڕاست و دروست ئەوەیە کە دەبێت گوێ ڕابگیرێت بۆ منداڵان بە گشت گرنگی پێدانێکەوە ، لەگەڵ

ئاماژەدانێک بۆ هاندانیان ماچکردنیان ، لەگەڵ ڕاستکردنەوی هەندێک لە زانیارییەکان یان زیاتر ئاسانکردنی زانیارییەکانیان تاکو ڕوونتر بێت بە شێوازێکی چاک لەلای منداڵان ، گشت ئەمانەش هێزی پێ دەبەخشن تاکو بەردەوام بێت لەکاری لەبەرکردنی قورئان و هەوڵ و کۆششەکانی ، وە متمانە بەخۆ بوونیشی لا دروست دەبێت ، وە بە جوانیش سەعییەکانی قورئانی دەکات .

* * * * * * *

## ١٧- هاندانی منداڵان بۆ ئەوەی پێشنوێژی بۆ یەکتر بکەن :

بەتایبەت لە ماڵەوە کاتێک منداڵ لەگەڵ هاوڕێکانیان یان منداڵی دراوسێکان کۆبوونەوە ، ئاساییە گەر هانی منداڵەکانت بدەیت بۆ بەرنوێژی کردن بە هاوڕێکانی ، تاکو متمانە بە خۆ بوون لەلای زیاتر بێت ، وە تاکو زیاتر قورئان لەبەر بکات .

* * * * * * *

## ١٨- دانیشتنی هەفتانە بۆ لەبەرکردنی قورئان لە ماڵەوەدا :

پێویستە تاکەکانی خێزان هاوکاری یەکتر بن بۆ دانانی مەجلیس و دانیشتنێکی هەفتانە لە ماڵەوەدا تایبەت بە قورئانی پیرۆز لەگەڵ بەگەورەدانانی ئەو دانیشتنە و ڕێزگرتنی ، وە تامەزرۆبوون بۆیی و خۆشویستنی ، بەتایبەت بۆ منداڵان ، تاکو ئەم بۆنە هەفتانەیە ببێتە هاندانێک بۆیان بۆ لەبەر کردنی قورئان .

* * * * * * *

## ١٩- خولەکانی مزگەوت زۆر گرنگە لە ژیانی منداڵدا :

خولەکانی لەبەرکردنی قورئان لە گرنگترین شتەکانە کە پێویستە دایک و باوک سوور بن لەسەری و گرنگی پێ بدەن ، چونکە گرنگییەکی زۆری هەیە ، لەبەر ئەوەی منداڵ ئەچێتە ناو جیهانی کێبڕکێ کردنەوە لەگەڵ هاوتەمەنەکانی ، هەروەها بۆ ڕێکخستنی ڕێساکانی خوێندنەوەی قورئان و تەجوید .

* * * * * * *

## ٢٠- ڕێکخستنی پێشبڕکێی خۆش و سەرنجڕاکێش لەسەر قورئان :

ئەمەش پاڵنەری منداڵە بۆ لەبەر کردنی قورئان و گەڕان بەدوای گشت ئەو شتانەی کە پەیوەندییان بە قورئانی پیرۆزەوە هەیە ، دەبێت لەمەدا ئاسانکاری بۆ منداڵان لەبەرچاو بگیرێت .

* * * * * * *

**٢١- هاندانی منداڵان بۆ گەڕان و بەدواداچوون لە فەرهەنگە ئاسان و کورتەکان سەبارەت بە واتاکانی قورئانی پیرۆز :**

ئەمەش گرنگە بۆ گەشەکردنی سامانی زمانەوانییان ، وە پەیوەستییان بە قورئانی پیرۆز زیاتر ئەکات .

* * * * * * *

## ٢٢- هاندانی منداڵان بۆ خوێندنەوەی کتێبەکانی تەفسیرە ئاسان و کورتەکان :

وە زانینی تەفسیری قورئان هانیان ئەدات بۆ لەبەرکردنی قورئان ، ئەمەش لەگەڵ لەبەرچاو گرتنی قۆناغەکانی تەمەنیان ، وە سەرنج بخرێتە سەر تەفسیری ئەو ئایەتانەی کە چیرۆکە قورئانییەکان و سورەتە کورتەکان لەخۆ ئەگرێت .

* * * * * * *

## ٢٣- دانانی دانیشتنی زانستی بۆ منداڵان کە ڕێگەی بەرەو قورئانیان بۆ ڕۆشن بکاتەوە :

چەندان منداڵ خوای گەورە دەرووی خێری لێ کردووەتەوە بەهۆی ئامادەبوونی لە مەجلیسە زانستییەکان لەگەڵ دایک و باوکیدا ، وە قورئان و گشت ئەو شتانەشی کە پەیوەندییان بە قورئانەوە هەیە لای خۆشەویست بووە ، وە خۆشەویستی پرسیار و گفتوگۆ لە ناخیدا دەچەقێت ، بەوەش منداڵ دەگاتە پێگەی بەرز و شکۆ ، وە باشترین شکۆمەندیش لای خوای گەورە هەڵگرتنی قورئانەکەیەتی .

## ٢٤- بەکارهێنانی دەستەواژە قورئانییەکان لە ژیانی ڕۆژانەی منداڵدا :

باسی تەقوای خوا بکرێ بۆ منداڵ بە ئایەتی : ﴿ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا ﴾ [النحل: ١٢٨]، وە باسی گوێڕایەڵی دایک و باوک بە ئایەتی : ﴿ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴾ [البقرة: ٨٣]، وە جگە لەوانەش ئایەت گەلێکی زۆر هەن کە بەهۆیانەوە ئەتوانین ڕێگەی خێر و باشە نیشانی منداڵەکان بدەین لە ژیانی ڕۆژانەیاندا .

* * * * * * *

ئەمەش هەندێک ڕێوشوێنی گەورە و هاوکاری بوو بۆ منداڵان تاکو قورئانی پیرۆز لەبەر بکەن ، با لێرەشدا چەند شتێکی گرنگ و سەرەکیش باس بکەین وەکو :

- خۆشەویست کردن و هاندان لەبری توندوتیژی.
- تامەزرۆیی و ئاسانکاری لە بری قورس کردن.
- هاندان بە دیاری بەخشین و وتەی پاڵپشتی کارانە .
- کێبڕکێی و فێربوونی بە کۆمەڵ .
- خۆڕاگری بەردەوام و نەفەس درێژی .
- نزا و پاشان نزا و پاشانیش هەر نزا .

وصلَّى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم .

ستافی ماڵپەڕی بەهەشت و وەڵامەکان

ba8.org walamakan.com

